# فیتنەی دەجال

# و



# جیابوونەوەی پاکەکان

نوسین و ئامادەکردنی :
ڕەنج شێخانی

بسم الله الرحمن الرحيم

**فیتنەی دەجال و جیابوونەوەی پاکەکان**

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: " فیتنەی دەجال و جیابوونەوەی پاکەکان "

نوسین و ئامادەکردنی: " ڕەنج شێخانی "

دیزانینی ناوەوە: " عبدالله خاکی "

دیزاینی بەرگ: " محمد عبدالرحمن "

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

## پێشەکی:

الحمدلله رب العالمين الصلاة والسلام على قائد المرسلين محمد (ﷺ) وعلى اله و أصحابه ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين.

پاش ئەوەی لێرەو لەوێ کۆمەڵێك کەسی فکر ئەقڵانی و نەشارەزا لە بیرو باوەڕی ئیسلامی ڕەسەن، ماوەیەکە بەقەڵەمە ژەهراویەکانیان کەوتونەتە دژایەتی کردنی ئەو فەرموودە ڕاست و دروستانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە نیشانەکانی قیامەت، بەتایبەتیش باسی دەجال، وە هەروەها بەلارێ چون و هەڵخلیسکانی کۆمەڵێك خەڵکی داماوی مسوڵمان، لەسەر داواکاری کۆمەڵێك براو خوشکی بەڕێز بەپێویستم زانی زنجیرە باسێکی زانستی و هەڵقوڵاو لەدەقە شەرعیەکان و، سود وەرگرتن لە کتێب و نوسراو وتاری کۆمەڵێك زاناو بانگخوازی بەڕێزو جێ متمانەو کۆمەڵێك ماڵپەڕی بەهێز بۆ بەدوادا چونی ڕاجیاییەکان و، پلەی ڕاستێتی و لاوازی فەرموودەکان وەك ماڵپەڕ(مەرکەزی فتوای ئیسلام ویب، ملتقى أهل احديث)، هەستام بەنوسینەوەی باسێکی گرنگ لەژێر ناونیشانی، (فیتنەی دەجال و جیا بونەوەی پاکەکان)، بۆ مانەوەی نوسینەکەش بەباشم زانی بیکەم بە نامیلکەیەك و بڵاو بکرێتەوە إن شاء الله،

وەك وەڵامێك بێت بۆ ئەو چەواشەكارو عەقڵانیانەی كەوا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تەنازول دەكەن لە بیرو باوەڕەكەیانداو، خۆیان لەگەڵ كەش و هەوای ڕۆژدا دەگونجێنن، وە هەم پەیامێكیش بێت بۆ ئەو مسوڵمانانەی بێئاگان لەم فیتنە گەورەیەو، هێشتا ئەم فیتنەیە نەهاتوە هەڵخلیسكان لەدوای هە ڵخلیسكان دەستی پێكردوە، جا وەرە گەر ئەم فیتنەیە بێت، پێم وایە بەبێ دوو دڵی دەیان بەناو زاناو بانگخوازی گومڕاش دەبنە پاڵپشت و سەرخەری! بەپێی تێگەشتنم لە دەقە شەرعیەكان و بەڵگەكانی فەرموودە دەمەوێت زۆر بەوردی تیشك بخەمە سەر گەورەترین فیتنەو نیشانەی قیامەت كە ناسراوە بە كوێرەی درۆزن (دەجال) ئەو كەسەی كە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە (علیهم افضل الصلاة والسلام) هۆشداری نەدابێتە ئوممەتەكەی لە ترسناكی فیتنەی ئەم كوێرە درۆزنە كە خۆی بەخوا دەناسێنیت و، بەپێی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەردەمی ئادەم(علیه السلام) تا خاتەم كە پێغەمبەری ئیسلام محمدە (ﷺ) فیتنەی وا ڕوی نەداوە لەسەر زەویداو هەرگیزیش ڕونادات، ئەوەی كەلەسەرەتادا دەمەوێت تیشكی بخەمە سەر بۆ خوێنەری بەڕێز، ئەو ڕاستی یەیە كە هەرگیز پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) شتێكی نەوتوە

کە گومان لەڕاستێتی دا هەبوبێت مەگەر کەسانێکی نەزان و نەفام باوەڕی پێ نەکەن کە بەردەوام لەگوماندا بژین!.

وە من لێرەدا دەمەوێت تیشك بخەمە سەر شێوەو ڕوخسارو ناوی دەجال و ئەو شوێن و جێگەیانەی لێوەی دەردەچێت و لە کوێشدا ئیعلانی خوایەتی دەکات و کێشن شوێنکەوتوەکانی و چۆنیش دەبێت خۆمان بپارێزین لەم فیتنە گەورەیە!

هیوادارم خوای گەورە بە نیەتێکی پاکەوە ئەم کارە بچوکەمان لێ قبوڵ بفەرموێت و، بیخاتە سەر توێشوی کردەوە چاکەکانمان و ، لەهەڵەو کەم و کورتیەکانمان ببورێت.

**نوسین و ئامادەکردنی**

**ڕەنجدەر کوردی**

**١٤٤١ ی کۆچی**

**٢٠٢٠ ی زاینی**

## دەجال کێیە و شێوەو ڕوخساری چۆنە؟

پیاوێکە لەنەوەی ئادەمە (علیه السلام)، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) شێوەو ڕوخساری بۆ باس کردوین بۆ ئەوەی هەرکاتێك هات و فیتنەکەی دەرکەوت مسوڵمانان بیناسنەوەو بەو هۆیەوە خوای گەورە لەم فیتنە گەورەیە بمان پارێزێت و ڕزگارمان بکات.

ئەوەی کە لەفەرموودەکاندا ئیشارەیان پێدراوە ئەوەیە کەوا پیاوێکی گەنجی سورەو، باڵای کورتەو،قژی لولەو، ناوچەوانی پانەو، ملی ئەستور و گەورەیە، وە چاوی ڕاستی سڕاوەتەوە لەشوێنی خۆیداو وەك دەنکە ترێ وایەو، ڕوناکی تێدا نییە، نەچوە بەقوڵیدا، نەدەر تۆقیوە، چاوی چەپیشی عەیب دارەو گۆشتێکی زیادە بەپێڵوی چاویەوەیەتی و، سنگە پێیەکانیشی لێك نزیکن و پاژنەی قاچەکانی لێك دوورن!.

ئەم کوێرەی درۆزنە کە ئیعلانی خوایەتی دەکات لەسەر زەوی دا، مناڵی نابێت و نەزۆکە، خوای پەروەردگاریش بۆ ئەوەی مسوڵمانان لەفیتنەی بپارێزێت لە ناو چاوانیدا نوسیوەیەتی(ک،ف،ر) واتە کافر و مسوڵمانی خوێندەوار یان نەخوێندەوار بەویستی خوا دەتوانێت بیخوێنێتەوە!.

کەوابوو ئەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هۆشیاربن و بەجوانی ئەم سیفەتانە لە بەر بکەن و نەوەو براو خوشکەکانتان و خزمان و دۆستانی لێ ئاگادارو ووریا بکەنەوە،

چونکە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە (علیهم الصلاة والسلام) کە ئوممەتەکەی لێ ئاگادار نەکردبێتەوەو، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی: لەسەردەمی ئوممەتی مندا دێت!.

## بۆچی ناوی مەسیحی دەجالە؟

دیارە وشەی مەسیح بە چەندین دەشێوە مانای کراوە لەلایەن زانایانە وەو ئێمە نامانەوێ زۆر لەباسەکە دەچین و لە ڕاستیدا بۆ پێغەمبەر عیسا(علیه السلام) بەکارهاتوە، کە مەبەستی سڕینەوە دەگەیەنێت و، بەویستی خوای گەورە ئەم پێغەمبەرە پایە بەرزە دەستی بهێنایە بەسەر هەرنەخۆشیەکدا کە لەسەر لاشە دروست بوایە، خوای گەورە چاکی دەکردەوە.

وە دەجالیش بۆیە وای پێ دەوترێت چونکە ڕاستیەکان لەخەڵك دەشێوێنیت و دەیسڕێتەوەو، چەواشەیان دەکات، هەر وەك چۆن لە ئێستادا خاوەن نامەکان لە جولەکەو گاور، باس لەهاتنی خواکەیان دەکەن و بە مەسیح ناوی دێنن، مەبەستیان دەجالە نەك پێغەمبەر عیسا (علیه السلام).

هەروەك سەرۆکی ئەمریکا (ئۆباما) لە کرتەیەکی ڤیدیۆیی دا دەڵێت: ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کەوا ئێستا چاوەڕوانی خوایەك دەکەین بەیەك چاوەوە خوایەتی سەر زەوی بکات کە مەبەستی دەجالە!.

کەوابو دەجال ناوی پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) ی بۆ خۆی بردوەو ڕاستیەکان لە خەڵکی دەشێوێنێت و . دڵنیاش بن هەر لە ئێستاوە هەرچی ڕاگەیاندن و هێزی سەربازی هەیە لەخۆ ئامادەکردنن بۆ هاتنی کوێرەی درۆزن و، لەخزمەتی بەرنامەو پەیڕەوی ئەودان!.

لە کۆتایی شدا خوای گەورە بۆیە سەر لەنوێ عیسا (علیه السلام) دەنێرێتە خوارەوە بۆ کوشتنی(دەجال) تاوەکو ڕونی بکاتەوە بۆ خەڵکی سەرزەوی بەگشتی و بەتایبەتیش خاوەن نامەکان لە گاورەکان کە بەخوایان ناساندووە لەڕێی دەستکاری کردنی ئاینەکەیان لەلایەن جولەکەوە بۆیان ڕون بێتەوە کەوا عیسا(علیه السلام) تەنها پێغەمبەرێکی خوای گەورەیەو لە بەندەیەك زیاتر هیچی تر نییەو، دەجالیش مەسیحی راستەقینە نیەو ناوی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزەی بۆ خۆی دابڕیوە!.

## چی کاتێك دەجال دێت و لە کوێشەوە سەر هەڵدەدات؟

پێش ئەوەی دەجال بێت سەر زەوی کۆمەڵێك گۆڕانکاری گەورە بەخۆیەوە دەبینێت کە گرنگترینیان، لەناو چون و ڕوخانی مزگەوتی قودسە (بیت المقدیس) و دروست کردنەوەو بیناکردنەوەیەتی، بۆ ئەم مەبەستەش زۆردەمێکە سەرانی جولەکە کۆمەڵێکی زۆر خەندەق و تونێلیان هەڵکەندوە بەناوی، گەڕان بەدوای پەیکەری پێغەمبەر سلێمان(علیه السلام)، دەیانەوێت ژێر مزگەوتەکە کەندڕ بکەن تاوەکو بەتەواوی بینای مزگەوتەکە دەڕوخێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەڕابردوودا چەندین جار شێخ (رائید سەڵاح) بەرپرسی بزوتنەوەی ئیسلامی لەهێڵی سەوزدا، کە ئێستا لەزیندانی زایۆنیدایە، هۆشداری ئەم خەندەقەی داوە، ئەوەی پشت راست کردۆتەوە کەوا مزگەوتەکە لەداڕمان و ڕوخاندایە، وە ئێستاش زیاتر لەڕاستی ئەو ڕووداوەوە نزیکین پاش ئەوەی (ترمپ)ی سەرۆکی ئەمریکا شاری(قودسی) بە پایتەختی ئیسرائیل ناساندو ناوی شارەکەشیان گۆڕی بۆ(ئورشەلیم) و لەتازەترین هەنگاویشیان دا بەناوی نەخشەی سەدەوە سنورێکی فراوانتریان بۆ دەوڵەتەکەی جولەکە دیاری کردووە، کەبەتەواوی نزیك بونەتەوە لەو هەنگاوەی کەچەندین ساڵە پیلانی بۆ دادەڕێژن ئەویش ڕوخانی مزگەوتی (قودس)ە

دڵنیابن بەویستی خوای گەورە لەپاش ئەمەش کاول بونی شاری مەدینەی پیغەمبەری خوایە(ﷺ) کە ئەویش لەپاش پەلاماردانی هێزی سەربازی سوفیانییە، کە ئەوکاتە حاکمی عێراق و شامە، لە عێراقەوە لەشکر کێشی دەکاتە سەر وڵاتی حەرەمەین بۆ لەناوبردنی ئیمامی مەهدی(علیه السلام) و لەشکرەکەی، یەکەم جار پەلاماری شاری مەدینە دەدات و کاولی دەکات بەشێوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: سەگ دێتە سەر گۆڕەکەم کەس نیە دەری بکات، ئەوجا بەرێ دەکەوێت بەرەو شاری مەککە، بەڵام خوای گەورە لەنێوان مەدینە بۆ مەککەدا، دەیان کات بەناخی زەوی داو تەنها دوو کەس ڕزگاریان دەبێت و سوفیانی و لەشکرەکەشی لەوێدا تیا دەچن!.

## جەنگی(ملحمة الكبرا) ڕودەدات ناسراوە بە جەنگە گەورەکە!.

پاش کاول بونی شاری مەدینەو، تیاچونی سوفیانی و لەشکرەکەی، دەتوانین بڵێین هاتنی ئیمامی مەهدی(علیە السلام) و ڕووداوەکانی پێش هاتنی ئیمامی مەهدی، هەمووی بەڵگەی نزیك بونەوەی وادەی دەجال دەخاتە پێش چاوی مسوڵمانان، چونکە پاش ئەوەی سوفیانی لەناو دەچێت، ئیمامی مەهدی هێرشی پاك کردنەوەو ڕزگارکردنی وڵاتانی دوورگەی عەرەبی دەست پێدەکات و خوای گەورە سەرکەوتنی پێ دەبەخشێت، لەپاش ئەوە، وڵاتی فارس ڕزگار دەکات و،ئیتر هێزو شەوکەتێکی گەورە دەگەڕێتەوە بۆ ئوممەتی ئیسلام بەپێشەوایەتی ئەو کەڵە پیاوە چاوەڕوان کراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ئەگەر یەك ڕۆژ لەتەمەنی سەر ئەم زەویە مابێت ئەوە خوای گەورە درێژی دەکاتەوە تاوەکو ئەو ئیمامە بەڕێزەدێت!.

لەوەیە خەڵکانێك پرسیار بکەن و بڵێن: باشە چۆن ئەو هێزە دروست دەبێت و ڕۆژ ئاواو جولەکە لێی بێ دەنگە؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەڵێین: بێگومان بەپێ بەڵگەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوکاتەدا ڕۆژ ئاوا کەناسراوە بە ڕۆمیەکان لە فەرموودەدا، سەرقاڵی جەنگێکی گەورەن لەگەڵ دووژمنێکی زل هێزی پشتی خۆیانەوە، بۆیە نایان پەرژێتە سەر ئیمامی مەهدی و لەشکرەکەی و لە جیاتی خۆیان سوفیانی دەنێرن و، سوفیانیش تیا دەچێت!.

بۆیە بە ناچاری ڕۆمیەکان داوای یارمەتی و هاوکاری لە ئیمامی مەهدی دەکەن کە پێکەوە دژ بەو لەشکرە گەورەیەی پشتی ڕۆژ ئاوا بجەنگێن، جا ئەو هێزە گەورەیەش خوای گەورە خۆی باستر دەزانێت کەکێ یە بەڵام لەڕوکەش دا ئەوە دەبینرێت لە ئێستادا کەوا ڕوسیاو چین و هاوپەیمانەکانی لەبەرەیەکدان و ئەوروپاو ئەمریکاو هاوپەیمانانیشی لەبەرەیەکی تردان!.

لەپاش ئەم سەرکەوتنە گەورەیە مسوڵمانان دەستکەوتێکی باشیان دەبێت، بەڵام دووبارە ڕۆمیەکان پەیمان شکێنی دەکەن و لەژێر هەشتا ئاڵادا خۆیان کۆ دەکەنەوە بۆ پەلاماردانی ئیمامی مەهدی و لە شکرەکەی کە هەر ئاڵایەکیش دوانزە هەزار کەسی لەژێردایەو، ئیمامی مەهدیش پانزە هەزار کەسی لەگەڵە گەر بەزۆر سەیریان بکەین و بەکەمیش دە هەزار کەسە، ئەوکاتە ئیمامی مەهدی لە شاری (غەوطە)ی سوریایەو، لەشکری ڕۆمیەکانیش دێنە ناوچەی (أعماق)و (دابق) لە سوریا کە نزیکە لە ئاوەوە ئەو ناوچانە!. ئەم جەنگە ناسراوە بە جەنگە گەورەکە لەفەرموودەکانداو، مسوڵمانان دەبن بەسێ بەشەوە بەشێکیان هەڵدێن کە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت، بەشێکیشیان شەهید دەبن باشترین شەهیدانی خوای گەورەن لەسەر زەویدا، بەشێکیشیان خۆڕاگر دەبن و سەردەکەون هەرگیز خوای گەورە جارێکی تر توشی بەڵاو موسیبەتیان ناکات،

ئەم جەنگە چوار ڕۆژ دەخایەنێت و مسوڵمانان سەرکەوتن بەدەست دێنن بەسەرکردایەتی ئیمامی مەهدی(علیه السلام) و ڕۆمیەکان بەتەواوی تێك دەشکێن و بەشێوەیەك هەرگیز جارێکی تر ناتوانن لەشکرکێشی بکەنەوە سەرخاکی مسوڵمانان!.

لە دیدی سەرانی جولەکەو ڕۆژ ئاواشدا ناسراوە بە جەنگی جیهانی سێیەم (هرمجدون) کە جولەکە جیهانی مەسیحیەت و جیهانی ئیسلامی دەدات بەیەکداو، دواتریش خۆی و ملیارە ئاڵتونیەکەی خۆی دەمێننەوە لەسەر زەوی و دەجالیش خوایەتیان دەکات بەپێی نوسراوەکانی ئەوان، بەڵام ئەمە خەیاڵ پڵاویەو بۆ هەمیشە خوای گەورە سەرجەم پیلانەکانیان لەنێو گۆڕ دەنێت و، ناتوانن ئەم خەونە بێننە دی!.

زۆربەی نوسەران و سەرکردەکانی ڕۆژ ئاواش لەو باوەڕەدان کە خەڵکی ئێستا ئەو جیلەن کە ئەم جەنگە دەبینن!.

## ڕزگارکردنی ئەستەمبول (قستنطین)و چەند ڕوداوێک!

پاش سەرکەوتنی مسوڵمانان لەجەنگی (ملحمة الكبرا)دا و دەست کەوتنی دەست کەوتێکی زۆر لەم جەنگە گەورە جیهانیە گەورەدا کەماوەی چوار ڕۆژ دەخایەنێت ، پاش ماوەی لەشکرە شکست خواردو هەڵهاتوەکەی ڕۆمیەکان(ڕۆژئاوا) بەرەو شاری ئەستەمبوڵی ئێستا کە لە فەرموودەکاندا بە (قستنطين) باسی لێوە کراوەو دەفەرمووێت: بەشێکی لەئاودایەو بەشێکی لەوشکانی!، کە من خۆم ئەستەمبوڵم بینیوە بەوشێوەیەو ، ئەو کەسەشی بینیبێتی ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە!.

لەویادا حەفتا هەزا لە نەوەکانی ئیسحاق پێغەمبەر(عیە السلام) کە بە پێغەمبەری ڕۆمیەکان باسی لێوەکراوە لەڕابردوودا لە ناو فەرموودەکاندا، ئەم کۆمەڵە زۆرە لەناو ڕیزی مسوڵامانانداند و لەژێر ئاڵای ئیمامی مەهدیدان (عليه السلام) هێرش دەکەنە سەر ئەو شارەو بە سێ تەکبیر دەروازەی شارەکەیان بۆ دەکرێتەوەو ئەویش ڕزگار دەکەن و شمشێرەکانیان بە دار زەیتونی ئەو شارەوە هەڵدەواسن!.

کەدووبارەی دەکەمەوەو دەڵێم بەڕاستی زۆرجوان ڕونت کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا لەگەشتێکی دوو کات ژمێریدا لەساڵی (٢٠٠٦)دا لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا لەوشارە ، زۆر بەجوانی ئەو هەموو دار زەیتونەمان بینی و کاتێك پرسیارمان کرد لەکەسێکی

دانیشتوی ئەو وڵاتە، وتی: ئەستەمبوڵ داری زەیتونی زۆرەو ناوبانگیشی هەیە لەوبارەیەوە!.

پاش ڕزگارکردنی شارەکە، شەیتان پڕوپاگەندەی هاتنی دەجال بڵاو دەکاتەوەو هاواردەکات کەوا دەجال پەلاماری کەسوکارتانی دا لە شام!، هەر بۆیە خێرا مسوڵمانان خۆیان کۆدەکەنەوەو، دەگەڕێنەوەو دەزانن کەوا دەجال فیتنەیەکی گەورەیەو، کەس تواناى ڕوبەڕو بونەوەی ڕاستەوخۆی نیەو، چەند شوێنێکی تایبەتیش پارێزراوە لەو فیتنەیە بەپەلە، خۆیان دەگەیەننەوە شام و سەلامەت دەبن و شەیتانیش یەکەم جار درۆ دەکات، ئەوجا دەنگۆی دەجال وەك چۆن ئاگر بەناو پوشی وشکدا زوو دەڕوات و دەیسوتێنێت، ئاوا دەنگۆی هاتنی بڵاو دەبێتەوە!.

## هەندێك لەو ڕوداوە سامناکانەی کە پێش هاتنی دەجال ڕودەدەن!.

بەپێی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش هاتنی دەجال سێ ساڵ وشکە ساڵی دەبێت ، ساڵی یەکەم یەك لەسەر سێی باران نابارێت و یەك لەسەر سێی ڕوکی سەر زەویش ناڕوێت، ساڵی دووەم دوو لەسەر سێی باران نابارێت و، دوو لەسەر سێی ڕوەکی سەرز ەویش ناڕوێت، ساڵی سێ یەم کەکاتی هاتنی دەجالە یەك دڵۆپ باران لەئاسمان نابارێت و، یەك ڕوکی سەرزەویش ناڕوێت و بەو هۆیەوە هەرچی ئاژەڵی سم دارە لەناو دەچێت و ژیان زۆر سەخت دەبێت لەسەر زەویدا، بۆیە خەڵکێکی زۆریش شوێن دەجال دەکەون چونکە بەدوای ناندا وێڵن و تاقی کردنەوەیەکی سەخت بەرۆکی خەڵکی سەر زەوی گرتووە!.

یەك لەڕوداوەکانی تر سەبارەت بەهاتنی دەجال، ئەو جەنگە گەورەیەیە کەباسمان کرد تەنها چوار ڕۆژ دخایەنێت و ئەو لەشکرە زل هێزە لەناو دەچێت، بەشێوەیەك لەفەرموودەکان واباسی لێوە کراوە باڵندە بەئاسمانی ئەو جەنگەوە بڕوات دەکەوێتە خوارەوە!، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ تەقاندنەوەی ئەو هەموو چەکە کۆمەڵ کوژیە یە کە کەش و هەوای ئاسمان و زەویش تێك دەدات و گەر جوان لەفەرموودەکان ورد بینەوە دەبینین لەم جەنگەدا باس لەشمشێر نەکراوە!.

بەلام جەنگی دوای ئەم کەڕزگارکردنی شاری (قستنطین)ە باس لە شمشێر دەکرێتەوە، کە پێدەچێت دوای ئەو جەنگە ئیتر تەکنەلۆجیاو پێش کەوتن لەکار بکەوێت و، ئەو دووکەڵە ڕەشەش بەری تیشکی خۆر بگرێت و، ڕێگە لەباران بارین بگرێت، بەشێوەیەك زانایانی گەردوون ناسی، باسیان لەجەنگێکی وا گەورە کردووە وتویانە گەر ڕوبدات تیشکی خۆر بۆ ماوەی ساڵێك نایدات لەسەر زەوی، کە ئەمەش گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ فەرموودەی مانەوەی دەجال لەسەر زەویدا کە ڕۆژی یەکەمی بەساڵێك تێدەپەڕێت و ڕۆژی دووەمی بەمانگێك و ڕۆژی سێیەمی بە هەفتەیەك و باقی ڕۆژەکانی تری وەك خۆی لێ دێتەوە، گەورە ترین بەڵگەیە بۆ ئەو ڕوداوە واللە اعلم!.

خوای گەورەش زاناترە لەسەر ئەم پێشبینیەو، گەر پێکابێتمان ئەوە لەخوای گەورەوەیەو گەر نەشمان پێکابێت هەڵەی خۆمەو داوای لێبوردن دەکەم لەسەری لای خوای گەورە!.

## دەرکەوتنی دەجال لەخوراسانەوەو، شوین کەوتنی حەفتا هەزار جولەکە لەشاری (ئەسفەهان) ی ئێران!

دەجال لەدایك و باوکێك لەدایك دەبێت کە ماوەی سی ساڵ منداڵیان نابێت و دواتر خوا دەجالیان پێ دەبەخشێت و، دەجال بۆ خۆشی نەزۆکەو وەچەو نەوەی لێ ناکەوێتەوە، وەك لەسەرەتاد باسی شێوەو ڕوخساریمان کردوە!.

سەرەتای دەرکەوتنی دەجال لە خوراسانەوە سەر هەڵدەدات ، کە خوراسانیش لە مێژوودا بەو ناوچە شاخاویانە وتراوە کە دەکەوێتە بەشێك لە سەروی ڕۆژ هەڵاتی ئێران و نیوەی سەروی ئەفغانستان وبەشێکی زۆر لە ناوچەکانی باشوری وڵاتی روسیای جاران کە بە یەکیەتی سۆڤیەت ناسرابو، بەڵام لەپاش ڕوخانی ئەو یەکیەتیە زۆربەی هەرێمەکان سەربەخۆی خۆیان راگەیاندووە!

ئەم ڕونکردنەوەیەشم بۆیە باس لێوە کرد، چونکە زۆربەی مسوڵمانان بەهەڵە حاڵی بون و، وادەزانن ئەم خوراسانە ، ناوچەی خوراسانی ئێران دەگرێتەوە بەتەنها، کە ئەمەش هەڵەیەو خوراسان ناوچەیەکی فراوانەو خوای گەورەش خۆی باشتر دەزانێت لە کام ناوچەیانەوە سەرەتا دەردەکەوێت!.

پاش ئەوە دەجال دێتە شاری(ئەسفەهان)ی ئێران و بەپێی دەقی فەرمووده سەحیحەکان لەو شارەدا حەفتا هەزار جولەکەی کۆڵوانە سەوز دوای دەجال دەکەون!
لاتان شتێکی ئاسایی بێت کەوا لە ئێستادا شاری(ئەسفەهان) بە یەکەم شار ناسراوە لە جیهانی ئیسلامیدا کە جولەکەی کۆڵوانە سەوزی زۆر بێت، بۆ پشت راست کردنەوەی ئەم ووتەیەش لەساڵی (١٩٩٨)دا، مامۆستایەکی بەڕێزو خۆشەویستم بەناوی مامۆستا بەهزاد، کە وانەی شەرعیم لا دەخوێند، بۆی گێڕامەوە کە چەند ساڵێك پێشتر لە شاری(بەندەر عەباس) ی ئێران ئیشی کرێکاری کردووە، بەهۆی بەرزی پلەی گەرماوە نەیتوانیوە درێژە بە ئیش و کارەکەی بدات و، لەڕێی هاوڕێ یەکیەوە ئاگادارکراوەتەوە کە بچێتە شاری(ئەسفەهان) ئیشی پاسەوانی بینایەکی بۆ پەیدا کردووە!.
وتی: باوەڕ بکەن هەر بە پاسی گەورەی نەفەرات کە ڕۆشتم بۆ ئەو شارە، لەگەڵ داغڵی شارەکە بوم هەتا پاسەکە گەشتە گەراجی گەورەی خۆی کە ناسراوە بە(ترمیناڵ) بەچاوی سەری خۆم دەیان جولەکەم بینی عەبای سەوزیان بەسەر شانەوە بوو ، هەروەك چۆن لەفەرموودەکاندا باسیان لێوە کراوە، وتی: لەگەڵ ئەوەم بینی ترسێك بە ناو گیانمدا هات و بەبێ ئەوەی برۆم بۆ لای هاوڕێکەم بلیتی پاسم بڕی و بەرەو شاری (تاران) گەڕامەوەو، لەوێوە پەیوەندیم کرد بە هاوڕێکەمەوەو

وتم: کاکە بەخوا تۆ لەشوێنێکدا دەژیت کە سەرچاوەی فیتنە لەوێوە دەست پێدەکات!.

ئەم باسەشم بۆیە باس کرد تاوەکو زیاتر مسوڵمانان بەرچاو ڕۆشن بن و دڵنیابن لەوەی کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ شتێکی نەفەرمووە بەبێ ئیزنی خوای گەورەو، سەرجەم ئەم ڕوداوانەی لەڕێی وەحی و نیگای خوای گەورە پێ گەشتوەو، ئەوەتا ئێستا ئێمەش بەچاوی سەر پێشهاتی ڕووداوەکان دەبینین، تەنانەت لە تازەترین زنجیرە دراماو فلیم دا بەناوی مەسیحی ڕزگارکەر کە سەری ساڵی ٢٠٢٠ بەشی یەکەمی بە دە ئەڵقە بڵاو کرایەوە ، ئەگەرچی فلیمەکە فلیمێکی زۆر بێ مستەوایەو پڕە لە درۆو خورافیات و چەواشەکاری بەڵام ئەوکەسەی کە بەحساب دەوری سەرەکی مەسیحی ڕزگار کەر دەبینێت لەفلیمەکەدا خەڵکی وڵاتی ئێرانەو کەسێکی فارسی زمانیان هەڵبژاردووە کەپێشتر لەڕێی مامی یەوە فێری جادوو کراوەو، بچێتە هەروڵات و ناوچەیەکیش بەزمانی ئەو شوێنە قسەدەکات و، بەخەیاڵی خاویان بۆ سەرنج ڕاکێسانی مسوڵمانان لەوڵاتانی ئیسلامیش دا بە ئیمام و پێشەوا بانگی لێوە دەکرێت و، وا دەورەکەی بۆ دانراوە کە ئەو جیاخوازی ناکات لەنێوان هیچ بیروباوەڕو ئایدیایەك داو بەڵکو ڕزگارکەری مرۆڤایەتی یە، کە ئەمە زیاتر ئەوەمان بۆ دەسەلمێنیت ئەوان زۆر لەمسوڵمانان زیاتر متمانەیان بە فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام هەیە (ﷺ) بەڵام لەهەوڵی ئەوەدان بەسودو قازانج بۆ خۆیان بیشکێننەوەو، لەڕێی وتارو نوسین و فلیم و

زنجیرەکانیانەوە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشن کە دەجال ی درۆزن عیسا (علیە السلام)ی ڕاستەقینەیە، چونکە زۆر دەمێکە ئەوان خەریکی ئامادەکارین بۆ هاتنی دەجال و زۆربەی فەرموودەکانیش ئەوەمان بۆ ڕون دەکەنەوە کەوا جولەکە زۆر دەمێکە لەچاوەڕوانی دەجالدایەو بەڕزگارکەری ملیارە ئاڵتونیەکەی خۆیان ناوی دەبەن، هەر بۆیەش دەبینین سەرەتا جولەکە بە نهێنی زەمینە سازی بۆ دەکات و هەر خۆشیان پێشوازی لێدەکەن!.
بابچینەوە سەر باسەکە بۆیە دەبینین لەم شارەشدا دەجال خوایەتی خۆی بۆ سەر زەوی ڕاناگەیەنێت و بەڕێ دەکەوێت بەرەو عێراق کە ناسراوە بە وڵاتی ستەم کاران و، ئەگەر چاوێك بەلاپەڕەکانی مێژوودا بخشێنینەوە دەبینین هەرچی کوشت و کوشتارو سەرو قۆچی فیتنە هەیە هەمووی لەم عێراقەدا سەری هەڵداوەو، دەجالیش تا دەگاتە نێوان شام و عێراق، کە بەداخەوە گەر جوان سەیری ئەو سنورە بکەین بەشێك لە کوردستانی خۆمان دەگرێتەوەو نزیکی ناوچەی شەیتان پەرستەکانەو، لەویادا خوایەتی خۆی ڕادەگەیەنێت و بەلای راست و چەپیدا کوشت و کوشتارێکی زۆر ڕوودەدات لەوناوچەیەدا، ئیتر بەتەواوی خەڵکی دەبنە دوو بەشەوە، بەشێکیان شوێنی دەکەون و بەشێکیشیان ڕوبەڕوی دەبنەوەو شوێنی ناکەون!.

## مانەوەی دەجال لەسەر زەوی داو ئەو شوێنانەی دەجال ناتوانێت بڕواتە ناوی!

پاش ئەوەی دەجال لە نێوان عێراق و شام دا خوایەتی خۆی ڕادەگەیەنێت و کوشتارێکی زۆر دەکات و، بۆ ماوەی چل ڕۆژ یان چل شەو دەمێنێتەوە لەسەر زەوی داو، زۆربەی ناوچەکانی سەر زەوی دەگەڕێت، بێ لەو ناوچانەی کە ڕێگری لێکراوەو، ناتوانێت بچێتە ناویان، إن شاء الله باسی دەکەین!.

ەبارەت بە مانەوەی دەجال لەسەر زەویدا لەفەرموودەکاندا هاتووە کەوا ڕۆژی یەکەمی بەساڵێك و ڕۆژی دووەمی بە مانگێك و ڕۆژی سێ یەمی بە هەفتەیەك تەواو دەبێت و باقی ڕۆژەکانی وەك خۆی لێ دێتەوە، بۆ ئەم حالەتەش زانایانی ئیسلام بەشێکیان دەیگەڕێننەوە بۆ ئەو جەنگ و کوشتارەی کە لە جەنگە گەورەکەی(ملحمة الكبرا)دا لەپێش هاتنی دەجال ڕوی داوەو، بەو هۆیەوە بەری تیشکی ڕۆژ بە دوکەڵ و هەوری ڕەش دەگیرێت و، بۆماوەی ساڵێك تیشکی خۆر نایدات لەسەر زەوی پاشان تامانگێکی تر جارێکی تر دەیداتەوە لەسەر زەوی تائەوەی لەپاش هەفتەیەکدا کە بە سێیەم ڕۆژی دەجال ناسراوە ئیتر بەری تیشکی خۆر بەردەبێت و، ئەو دوکەڵ و پەڵە هەورە ڕەشە نامێنێت و، ژیان ئاسایی دەبێتەوەو، خەڵکی شەو ڕۆژیان بۆ ڕون دەبێتەوە وەك جاری جاران!.

بۆ زیاتر پشت بەستن بەم بۆچونە پرسیارەکەی هاوەڵانی بەڕێزە(خوا لێ یان رازی بێت)، سەبارەت بەو شەو و ڕۆژەی کەبەساڵێك تەواو دەبێت کەوا ئایا تەنها پێنج فەرز نوێژی تێدا بکەن؟. لەوە لاَمدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: نا هەر ئەندازەی شەو و ڕۆژێك حساب بکەن و پێنج فەرزی تێدا بکەن ، کە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەوەی بگەینە ئەو باوەڕەی کەوا خەڵکی شەو ڕۆژیان لێ تێك دەچێت و بە ئاسانی ناتوانن شەو و ڕۆژ لەیەڵ جیا بکەنەوە!.

وە هەروەها گەر سەیری فەرموودەی ڕووداوەکانی پێش هاتنی دەجال بکەین دەبینین ئەو ساڵەی دەجالی تێدا دێت، نەباران دەبارێت نە ڕوەکیش سەوز دەبێت، ئەمەش دووبارە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ جەنگە گەورەکەی پێشو کە هەرچی ئەتۆم و چەکی کۆمەڵ کوژە تیایدا دەتەقێتەوەو، بەشێوەیەك ژیان تێك دەدات لەسەر زەوی دا، تەنانەت باڵندەش بە ئاسمانی جەنگەکەدا بڕوات دەکەوێتە خوارەوە، خوای گەورەش زاناترە!.

پاش بیستنی هەواڵی هاتنی دەجال و بڵاوبونەوەی هەواڵەکە، مسوڵمانان لەهەر شوێنێکی سەر زەوی دا بن خۆیان دەگەیەننە ئەو ناوچانەی کەدەجال ناتوانێت بچێتە ناویان و، لەوکاتەشدا هیچ هێزێك نیە لەسەر زەوی ڕوبەڕوی دەجال بێتەوە ، تەنها مسوڵمانان نەبێت!.

ئەوانیش بەهۆی ئەوەی دەزانن ڕوبەڕوبونەوەی دەجال لەتوانای ئەواندا نییەو تەنها پێغەمبەری خوا عیسا(علیه السلام) دەتوانێت بیکوژێت،

پاشە کشە دەکەن بۆ ناوچە سەلامەتەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمامی مەهدی(علیه السلام) کە ئەوکاتە لە ناو مزگەوتی (قودس) دایە،بەو هۆیەشەوە لەهەندێك لە گوندەکانی شام دا کۆمەڵێك لە مسوڵمان کۆ دەبنەوەو دەکەونە بەرامبەر دەجال و لەشکرەکەی و ڕوبەڕو بونەوە دەست پێدەکات لەگەڵ دەجالداو، بەڵام قەدەری خوا سەرجەمیان شەهید دەکرێن بەدەستی دەجال!.

سەبارەت بەو شوێنانەشی کە دەجال ناتوانێت بڕواتە ناوی، هەردوو شاری (مەککە)و(مەدینە) و مزگەوتە پیرۆزەکانی ئەم دوو شارە، لەگەڵ مزگەوتی(قودس) و مزگەوتی(طور) کە دەکەوێتە کێوی طورەوە، ئیتر باقی ناوچەکانی سەر زەوی دەجال دەتوانێت بڕواتە ناوی و فیتنەو ئاژەوەو خراپەکاری تێدا بڵاو بکاتەوە، بەشێوەیەك ئەو ئامێرەی هاتو چۆی پێدەکات لەفەرموودەکاندا باسی لیوە کراوە وەك پەڵە هەورێکە با پاڵی پێوە بنێت، کە ئەمەش ئیعجازێکی گرنگی فەرموودەکانی پیغەمبەری خوایە(ﷺ) و ئاماژەیەکی گرنگە بۆ فڕۆکەی ئێستا کە بە هێزی با دەڕوات لە ئاسماندا!.

## فیتنەکانی دەجال و شوێن کەوتوانی دەجال و ئەوانەشی دوای ناکەون!

هەروەك لەسەرەتادا باسمان لێوە کرد، دەجال گەورەترین فیتنەیە بەرۆکی مرۆڤایەتی بگرێت و نە لەڕابردوودا نە لەپاش ئەو فیتنەی وا گەورە نەبینراوەو ناش بینرێتەوە پاش ئەو، چونکە ئەو کارو کردەوانەی دەجال ئەنجامیان دەدات لەسەروی دەسەڵاتی مرۆڤەوەیە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوا لە ئوممەتەکەی دەکات بەهچ شێوەیەك ڕوبەڕوی دەجال نەبنەوە.

چونکە باوەرداری وا هەیە دەچێت بۆلای دەیەوێت بەدرۆی بخاتەوە بەڵام چاوبەست و فێڵی وای لێدەکات، ئەویش باوەڕی پێدەکات خواپەنامان بدات!.

لێرەدا پێم خۆشە هەڵوێستەیەك لەسەر ئەم باسە بکەین ئەویش ئەوەیە، باوەڕتان هەبێت لەساڵی(١٩٩٦) کاتێك ئەم فەرموودەیەم بیست زۆرم بەلاوە سەیر بو!، وتم باشە چۆن کەسێك باوەڕدار بێت و شارەزابێت لە دینی ئیسلام شوێنی دەجال دەکەوێت نەك وەك گومان بەڵکو بەلامەوە سەیر بو!؟

بەڵام ئێستا بۆ خۆتانی بەجێ دێڵم و ئەوەی خوای گەورە بەرچاو ڕۆشنی کردبێت و دامەزراوی پێ بەخشیبێت لەسەر دینەکەی بەچاوی سەری زۆر بەڕونی دەبینێت کەوا چۆن ڕۆژانە دەیان مامۆستاو بانگخواز

کەلەڕابردوودا جێی هیواو ئاوات و متمانەی مسوڵمانان بوون کەچی ئێستا بۆ پارەو پلەو پایەو پۆست خۆیان دۆڕاندووە پەنا بەخوای گەورە بێ لەو لێشاوە زۆرەی خەڵکی کە ڕۆژانە لەدینەکەیان هەڵدەگەڕێنەوە، خوای گەورە پەنامان بدات.

## بەشێك لەو فیتنانەی دەجال کەخەڵکی پێ فریو دەدات بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کردوە تیشك دەخەمە سەر هەندێکیان!.

١. زۆرترین شوێنکەوتوانی دەجال ئافرەتانن، چونکە لەرێگەی سیحرو جادووەکانیەوە دەتوانێت کاریگەری بکاتە سەر ئافرەت و لەرێ دەری بکات، هەر بۆیە کاتێك نزیك دەبێتەوە لەشاری مەدینە کۆمەڵێك فریشتەی بەرێز کەخوای گەورە لەدەوری ئەو شارو مزگەوتانە دای ناون بۆ پاراستنی لەدەجال و بەو هۆیەوە دەجال ناتوانێت بڕواتە ناویانەوە ، هەرکات دەیەوێت بڕوات ڕوبەڕوی دەجال دەبنەوەو ناتوانێت بچێتە ناو شارەکە، لەنزیك شاری (مەدینە)دا پیاوان خێزان و کچ و ژنەکانیان دەبەستنەوە بە پەنجەرەو دەرگای ماڵەکانیانەوە، چونکە دەیانەوێت خۆیان بگەیەنن بەدەجال!.

٢. دەجال ئاو ئاگری پێ یە، کە لەڕاستیدا ئاوەکەی ئاگرەوسوتێنەرەو، بەپێچەوانەشەوە ئاگرەکەی ئاوێکی سازگارو پاکە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوامان لێدەکات کە ئەگەر بینیمان خۆمان بخەینە ناو ئاگرەکەیەوە، نەك ئاوەکەی چونکە ئاوەکەی توشی کارەساتی لەدین دەرچونمان دەکات خوا پەنامان بدات!.

٣. لەکاتی ڕۆشتنی دەجال بەسەر ناوچەکانی سەر زەوی دا، بگاتە هەر ناوچەیەك بانگەوازیان دەکات، ئەگەر بێت و خەڵکی ئەو ناوچەیە

شوێنی بکەون ئەوە بەویستی خوا داودەکات لە ئاسمان باران ببارێنێت و ڕوەك و سەوزە گیا بڕوێت و مەڕو ماڵاتیان زیاد دەکات و قەڵەو دەبن و گوانی مەڕو ماڵەتەکانیان پڕ شیر دەکات!.

بەڵام هەر ناوچەیەك وەڵامی نەدەنەوەو بەدرۆی بخەنەوە بەویستی خوا کاتێك بەجێ یان دەهێڵێت، خاك و ئاوەکەیان پڕ خوێ دەبێت و، وشك دەبێت و ئیتر هەرچی ماڵ و سامانیشیان هەیە بەدەستیانەوە نامێنیت و، دەدات بەلای کەلاوە ڕوخاودا و دەڵێت زێڕو کەنزەکەت بێنە دەرەوەو لەگەڵ خۆی دەیبات!.

٤. یەکێکی تر لە فیتنەکانی بەویستی خوا مردو زیندو دەکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە کابرایەکی دەشتەکەی بانگ دەکات و پێی دەڵێت: ئەگەر دایك و باوکت بۆ زیندو بکەمەوە باوەڕم پێدەکەیت؟،ئەویش دەڵێت: بەڵێ، لەوکاتەدا دوو جنی شەیتانی خۆیان دەخەنە سەر شێوەی دایك و باوکی و پێی دەڵێن: کوڕم باوەڕی پێ بکە ئەوە خوای تۆیە، ئەویش باوەڕی پێدەکات!، کەوابو مردو کاتێك مرد زیندو نابێتەوە جارێکی تر ئەوکارەش تەنها بۆ گومڕاکردنی خەڵکیەو هیچی تر!.

لەوکاتەدا پیاوێك لەشاری مەدینە لەباشترین مسوڵمانی ئەوکاتە دێتە دەرەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی دەجال و، لەوکاتەدا کە نیشانەکانی دەبینێت، دەڵێت: شایەتی دەدەم کەوا تۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی باس کردوین، دەجالیش لەوکاتەدا ڕوو دەکاتە خەڵکەکەی دەوری و دەڵێت: گەر بیکوژم و زیندوی بکەمەوە باوەڕم پێدەکەن؟

ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، لەوکاتەدا بەویستی خوا کابرا دەکوژێت و ، پاشان بەویستی خوا زیندوی دەکاتەوەو، ئەم جارەیان پیاوە مسوڵمانەکە زیاتر دڵنیا دەبێت و دەڵێت: سوێند بەخوا تۆ دەجالی درۆزنیت، لەوکاتەدا دوبارە دەجال دەیەوێت بیکوژێتەوە بەڵام ئەم جارەیان خوای گەورە نایەڵێت زاڵ بێت بەسەریداو ڕزگاری دەکات لەدەستی!.

دیارە زانایانی ئیسلام فیتنەی زۆریان باس کردوە، بەڵام ئەوەی کەگرنگە لێرەدا ئیشارەی پێ بدەین ئەوەیە کەوا دڵنیابن هیچ کارێکی دەجال بەبێ ویستی خوای گەورە نابێت و ئەمەش تاقی کردنەوەی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی ، هەر بۆیە ئەم فیتنەیەش مسوڵمانی لەخواترس و خاوەن ئیمانی لێ پارێزراوە بەویستی خوا!.

## لەناو چون و تیاچونی دەجال و چۆنیەتی خۆپاراستن لێی!

پاش ئەوەی دەجال ئەو ماوەیەی بۆی دیاریکراوە لەسەر زەویدا خراپەکاری و گومڕایی یەکی زۆر دەنێتەوە، ئیتر کاتی ئەم تاقی کردنەوە قورسەی سەر شانی مسوڵمانان بەرەو کۆتایی دەڕوات ، پاش ئەوەی دەچێتە سەر کێوی (ئوحود)و ناتوانێت بچێتە ناو شاری (مەدینە) لە دوورەوە بینای مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لە فەرموودەیەکی بەرزکراوەدا باسی لێوە کراوە،پیشانی شوێنکەوتوانی دەدات!.

دەڵێت: ئەو بینا سپیە ماڵەکەی(ئەحمەدە) کە ئێستا زۆر بەڕونی لەئاسمانیشدا وێنەی مانگە دەستکردەکان ئەو بەڵگەیەمان بۆ دەخەنە ڕوو کەوا وێنەی هەردوو مزگەوتی حەرەم سپی یەو ڕوناکە!.

لەویادا خوای گەورە چەند بومە لەرزەیەك دەدات لەشاری(مەدینە)و هەرچی دووڕو مونافیق هەیە فڕێی دەداتە دەرەوە بۆ لای دەجال و، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو شوێنانەی کە لێی قەدەغە کراوەو، لەبەردەمیاندا فریشتەی خوا بە ڕیز وەستاون بە شمشێرەوە بەچاری ناچاری پشت هەڵدەکات و بەرێ دەکەوێت بەرەو(شام) و دەوری مزگەوتی (قودس) دەگرێت، کە لەوکاتەدا ئیمامی مەهدی(علیە السلام) و زۆربەی مسوڵمانان لەناو مزگەوتەکەدان،گەمارۆیەکی سەختیان دەخرێتە سەر و،

دەجالیش بەباشترین هێزو چەکی ئەوکاتە دەوری مسوڵمانانی گرتوەو، ڕوبەڕوی ئیمامی مەهدی(علیه السلام) و مسوڵمانان دەوەستێتەوە!.
کۆتا ڕۆژی دەجال دێتە پێشەوەو مسوڵمانان حاڵیان زۆر خراپەو زۆر برسی و تینون ، بۆیە بڕیار دەدەن پاش نوێژی بەیانی ئەو ئاو خواردنە کەمەی کە پێ یان ماوە بیدەن بەیەك و، ئەگەر چی ناتوانن ڕوبەڕوی دەجال و لەشکرەکەی ببنەوە بەڵام چیترنایانەوێت لەچاوەڕوانیدا بمێننەوە و، ئەوانیش دەیانەوێت وەك براکانیان، کە لەگوندەکانی(شام) ڕوبەڕوی دەجال وەستانەوەو شەهید بون، ئەمانیش بگەن بەو پلە گەورەیە!.
بانگی بەیانی دەدرێت و قامەت دەکرێت بۆ نوێژی بەیانی، ئا لەوکاتە بەڵێنی خوای گەورە دێتە دی و پێغەمبەری پایە بەرز عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لێبێت) لەلای منارە سپیەکەی شاری (دیمەشق) دادەبەزێتە خوارەوە ، کە ئەوکاتەی ئەم فەرموودەیە باس کراوە ئەو منارە سپیە بونی نەبووە!، بەڵام ئێستا دروستکراوەو بونی هەیە!.
بەڵێ ئەم پێغەمبەرە پایە بەرزە خۆی دەکات بە ناو مزگەوتەکەی قودسدا و مسوڵمانان لە خۆشیاندا هەناسەیەکیان بە بەردا دێتەوە، پێشەوای مسوڵمانان کە ئیمامی مەهدیە(علیه السلام) دەیەوێت بێتە دواوە،

ڕێگە بۆ پێغەمبەر عیسا(علیه السلام) خۆش بکات تا پێش نوێژی بکات، بەڵام ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە هەردوو دەستی دەخاتە سەر شانی ئیمامی مەهدی و پێ دەڵێت: دەبێت خۆت پێش نوێژی بکەیت وئەم فەزڵێکە خوا بەخشیویەتی بە ئوممەتی محمد(ﷺ) هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت شانازی یە بۆ ئوممەتەکەم کەوا پێغەمبەرێکی وەك عیسا(علیه السلام) لەپشتیانەوە نوێژ دەکات!.

لەپاش تەواوبونی نوێژ لەسەر داوای پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) دەرگای مزگەوتی(قودس) دەکرێتەوەو دەجال لەبەرامبەر مزگەوتەکەدا لەگەڵ لەشکرەکەی ڕاوەستاوەو، لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە دەبینێت دەزانێت وادەی تیاچونی نزیك بۆتەوە، بەپەلە هەڵدێت و ڕادەکات هەتا لە دەرگای(لەد)دا دەیگرێت کە دەکەوێتە لای قودسەوە، لەوکاتەدا دەجال دەیەوێت خۆی لەناو بەرێت،هەر وەك چۆن خوێ لەئاودا دەتوێتەوە دەجال ئاوا دەتوێتەوە!، بەڵام پێغەمبەری پایە بەرزعیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوایان لێبێت) دەفەرمووێت: سوێند بەخوا نایەڵم خۆت بمریت و دەبێت من لەناوت بەرم، هەتا بۆ خەڵکی بسەلمێت کەتۆ ناوی منت بۆ خۆت بردووەو خەڵکت پێ گومڕا کردووە،خێرا بەشمشێرەکەی دەستی دەیکات بە دووکەرتەوەو لەپێش چاوی خەڵکیدا دەیکوژێت و خوێنەکەشی پیشانی خەڵکی دەدات!.

بەو شێوەیە فیتنەی دەجال کۆتایی پێدێت و خوای گەورە سەرکەوتنێکی گەورە بە مسوڵمانان دەبەخشێت و، بۆ جارێکی تر خوای گەورە

ئوممەتی ئیسلام دووچاری بەڵاو تاقی کردنەوەی گەورە ناکاتەوە، ئیتر لەویادا هیچ دینێك نامێنیت غەیری ئیسلام و عیساش(علیه السلام) دەبێتە شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) إن شاءالله ئەوی دەمێنێتەوە دەتوانرێت لەباسەکانی تردا زیاتر تیشکی بخرێتە سەر!.

**سەبارەت بەچۆنیەتی خۆپاراستنیش لە دەجال و فیتنەکانی زانایانی ئیسلام چەند ڕێگایەکی جوانیان خستۆتە پێش چاومان کە بەخاڵ باسیان دەکەین.**

١. پە یوە ست بوون بە ئیسلامەوەو خۆ چەکدارکردن بە چەکی باوەڕ وناسینی خوای تاك و تەنها و زانینی ناو سیفە تە پیرۆزە کانی، وە بزانین دەجال مرۆ ڤێکە دەخواو دەخواتەوەو پا شەڕۆی هەیە خوای گە ورەش پاکو بێ عەیبە لەو سیفەتانە، هەروەها دەجال چاوی سە قەت و کوێرە ئە گەر خوا بووایە هەڵبەتە پێش هەموو شتێك چاوی خۆی چاك دەکردەوەو نەی دەهێشت خودی خۆی عەیبدار بێت، وەبزا نین هیچ کە سێك خوای گەورە نابینێت تا نەمرێت، بە ڵام دەجال هە موو کەس بە کافرو مسوڵمانەوە دەیبینن.

٢. دوعاو پە ناگرتن لە دەجال بە تایبەتی لە نوێژدا وە ك لە چەندین فەرموودە ی سەحیحدا هاتووە، هەروە ها ئە بووهوڕەیرە -خوا لێی ڕازی بێت- دە گێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:-

**(إذا تشهد أحدكم فليستعذ بالله من أربع يقول • اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ الْقَبْرِوَمِن عَذَابِ جهنم وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)**

واتە :- هەر کە سێکتان شایەتمانی هێنا لە نوێژدا (واتە لە تە حیاتد) با دوعا بکات و پەنا بەخوا بگرێت لە چوار شت، بڵێت: خوای گەورە پەنا

بە تۆ دەگرم لە ئازاری دۆزەخ، وە لە ئازاری گۆڕ، وە لە فیتنەی زیندوبونەوەو مردن، وە لە خراپەی فیتنەی مەسیحی دەجال.
بۆیە پێویستە مسوڵمان ئەم دوعایە بکات لە نوێژداو لە دوای شایەتمانی تەحیات وە هەوڵ بدات لە بیری نەچێت، جونکە پیاو چاکانی پێشین زۆر پەیوەستبوون پێوەی، تەنانەت پیاوچاکێکی (تابیعی)وەك ئیمام (طاوس) ئە گەر کوڕەکەی لە نوێژدا ئەو دوعایەی لە بیر بکردایە، نوێژەکە ی پێ دووبارە دەکردەوە.
٣. لە بەرکردنی دە ئایەتی یەکەمی سەرەتای سورەتی (کەهف)، یان دە ئایەتی کۆتاییش هاتووە، وە خوێندنی ئەو ئایەتانە لە کاتی ڕوبەڕو بونەوەی دەجالدا.
٤. هەڵهاتن وە دوورکەوتنە وە لە دەجال و ئە گەر توانرا پە نا ببرێتە بەر شاری (مە ککە)و (مە دینە) یان مزگەوتەکانی (قودس) و(طیبة) ، ئەگەر نەگەشتە مزگەوتەکانیش پەنا بۆ چیاکان بەرێت ، چونکە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) باس کراوە کە دە جال نا توانێت بچێتە ناویان، وە پێویستە مسوڵمان هەوڵ بدات بە هیچ شێوەیەك بەرەو ڕووی دە جال نەڕوات و خۆی لە بینین و قسەکردن لە گەڵیدا بپارێزێت.

**تێبینی:** لێرەدا من تەنها پوختەیەکم هەڵبژاردووە لە فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆ گەران بەدوای سەرچاوەو دەقی فەرموودەکان و زیاتر شارەزابوون لە ناو سیفەتی دەجال و سەرجەم ئەو ڕووداو پێش هاتانەی کە باسمان لێوەکردووە بە دەقی فەرموودەکانەوە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ کتێبی (نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی) (لا / ١١٦- ١٤٥) کەلە لایەن مامۆستا هاوڕێ محمد ئەمین نوسراوە خوای گەورە بیپارێزێت.

**لە کۆتاییدا دە ڵێم: مسوڵمانان وریای دوارۆژو قیامەتی خۆتان بن سوێند بەخوا ئەمڕۆکە هێشتا دەجال نەهاتوە ئەوهە موو بەناوزاناو بانگخوازو مسوڵمانە وازیان لەدینەکەیان هێناوە!**

**جا باشە ئەگەردەجال بەوهەموو فیتنەیەوە بێت، ئەوکاتە ئەوخەڵکە چی هەڵوێستێکی دەبێت بەرامبەری؟**

**-خوا پەنامان بدات- لە گومڕایی ولاڕێ بوون. یارب العالمین.**

**بر اتان: ڕەنج شێخانی**